

# درۆکانی موقەددەس

شیعر

ساڵح سووزەنی

# SACRED EALSES

A CALLECTION OF POEM

SALIH SUZENI

1998

# درۆ موقەددەسەکان

ساڵح سووزەنی

شێعر ـ ١٩٩٨

---


ناوی کتێب : درۆکانی موقەددس

بابەت: شیعر

نووسەر ساڵح سووزەنی

پیتچین: بێگەرد ساڵح

رووبەرگ: سوارۆ ساڵح

چاپی : رۆژانۆ

تیراژ : ١٠٠ بەرگ

## هةمووي خةتاي ئةم تَوڤةية

هەمووی خەتای
ئەم تۆپەسەوزە هارەیە
خلار
خلار
ئەبێتەوە...
بۆ خۆشم ئاگیرێتەوە
هەرچەند ئەکەم
دەستم یارای
لەشم یارای
هزرم یارای ئەوەی نیە
راگیری کا و
نەچێتە ئەو دالانانەی
هەزار توێن و
هەرهیچشیان
بۆنی حەزیان



نەبیستووە
تاقە شەمێکیان تیا ناگرێ
( هەرهیچیشیان
هەمووی خەتای،
ئەم تۆپە نەحلەتیەیە،
لە ئەرز ئەچێ
کە دێتەوە شوێنی پاری
لە خوی ناچێ
لە ئاو ئەچێ
« هەر کە قامکی لێدرئێنێ
ئیتر ئاوی پیشوونیە»
وەکوو ئاگر،
کە مەشغەڵانی ئەنێری بۆ سینگی شەو
ئیتر ئەگرێ گرەکەی چرکەی پێشووە و
نەسووتەمەنیەش
هەوە....
هەمووی خەتای ئەم تۆپەیە،
بەرەو چاڵی ئەژدیهاکان
رامئەکێشێ....
بەرەو شوێنی
هەزار

بە هەزارم
دەبا...
ئاخ... تۆپەکە!
بێتوو رۆژێ
نەمسوورێنی بەشوێنیکا
ئوقرە ناگری
بێتوو شەوێ
نەمبەسیتی بە دارێکەوە
ئارام نابێ!
ئەمویست بەرەو جارە گوڵ و ... هتد
بمبەی ...
بەرەو دڕکستان ئەمکێشی...
ئەمویست
بەرەو بەهشتی ئەشق
هەڵمکێشی...
بەرەو دۆزەخ
دام
ئە
کێشی
ئاخ.. ئەم تۆپە
چەند جیاوازە



لەگەڵ ئەو تۆپە ئارامەی
بە سەر سەری تۆ وە شینە
چەند جیاوازە
لەو تۆپە رەش و سپیانەی
تێی هەڵئەدەن
لەو تۆپە رەشە گەورانەی
دا
ئە
نەون
لەو تۆپە حیزەسپیانە
پاڵ ئەکەون...
ئاخ... تۆپەکەم!
نە ئەتوانم،
فرێت بدەم
نەئیتر ئەو توانام هەیە
راگیرت کەم!
دەبا بدرێی بە دەم «با»وە
با تۆپی ئەرز هەڵتلووشێ!
با تۆپی پێ نەحلەتت کا...
با تۆپەرەش و سپیەکان،
هەر

دا

نە

ون...

هەر پاڵکەون

نا... ناتوانم راگیرت کەم!

نا...

نات..و...ان....

٣/٧/٧٦ سەقز



---

## یۆ... تۆ...ثیا

سەرتان ئێشێنم ئەزانم!

سەری سرتان...

باسی« ماسیەکی بچووکی یاخی»

و

«قەلێکی رەشی نگریس»

(کە هێندێ شاعیر ئێستا

ئەینەخشێنن)

باسی « شێرێکی کەر»و

«پاشایەکی عادڵ»

هەرگیز سەرابی سۆرابی پێ نایێتە

زەریا

رەشی ئەنازەی باڵاتان

بە سووری شێعر ناهەژێ

ئەزانم...

خەیاڵە... خەیاڵە ... ئەتوانێ

«یۆتۆپیا» ی سەری من بسوورڕێنی...

خەونە ... خەون

ساز ژەنی « سەمفۆنیا» ی سەیرانە...

من سوور و قەڵەم زەرد

ئاسمانیش

دەفتەری باخەڵم

ئا...را...می...

لە کوێی تۆ

سەوزەکەی ئەبەدی!

هەتایە وێڵم و

فەرهادی شاعیرم،

مێژوویەك شك نابە،

نەمکوژێ...

هەنووکە نامنووسێ

داهاتووش،

سەرابی زەمانەو

یۆتۆپیای ئەندیشەم...

..............

سەرتان لێ ئەشێوێ

ئەزانم

بەم زرەی زامانە

تۆ بڵێی قافڵەی تەمەنی ئاسایی کۆمەڵگا

بوەستێ؟

تۆ بڵێی یاخی بوون

هەتا کەی سێوێ بێ

خواکان،

ئادەمی لە بەهەشت پێ دەرکەن؟

ئەرێ من،

عەوداڵی کامە خوام؟

سەرتان و

سەراب و

یاخی بوون....

فەرهاد و

شێعریک و

سێوێکی هەمەرەنگ...

کامەرێ؟؟؟؟

کامە خوا؟؟؟؟

کامە ئەشق؟؟؟؟

یۆ...تۆ... پیا

.../٢/ ٧٧ سەقز

## دروَكا   مؤقەددەس

لەگەلْ«با» نەبووین
نەچووین سەرشێتانە
ئەوان،
با بردنی و مردن
ئێمەیان سووتان و
ماین
لەگەلْ « حەقیقەت» نەبووین
راستیەکانمان بەزاند
کاروان کوژە بردیانی و...
نەمان، ئەوان،
ئێمە حەقیقەتێکی ترمان ساز کرد
زاس.... اس ز...
ئاخ...



حەقیقەتەکان،
ئیمپراتوریەتی درۆبوون
چیها مرۆڤیان راو کرد...

شوێن کۆترێکی وەحش کەوتین
(ئەو کاتەی لاو بووین)
هەزارمان گرت...
هەو نەبوون
( هەر هیچپیشیان)
هەویش بوون
( هەر هەمووشیان)
ئاشق بووین
لە تۆفانەکانیشا
سینگمان نەئەترووکان
چاومان وەک بەرد
ئاخ ...
تۆفانەکانیش درۆبوون
بە کلوورەی ئەندامەکانما
تێپەڕین و
ها.. ها... ها..ها
پێئەکەنین....

...............

شوێن ئاسکێکی وەحش کەوتین

(ئەو کاتەی مام ناوەند بووین)

هەر چیمان دی،

بەنگی بوون...

بە «راک» نەرمیشیان ئەکرد...

جەنگەڵەکانیش..

شێرێکمان دی

توورە

گوایە «باتری» کومپیوتێرەکەی

سووتابوو...

ئاشق بووین

دەبوا بچووینایە و

« سیمورخ» مان بدیبایە...

ئاخ ...

ئێستا رەنگە پیر بین

سیمورخیش درۆبوو

خۆمان بە خۆمان ئەدۆڕاند...

ئەترسم مردنیش

درۆ بێ و



زلە رەنگاڵەکان

بەردەوام رەنگ بگۆڕن و

قەت نەمرن...

.

.

.

درۆکانی مۆقەددەس!

کەی پەیکەری راستی

لە شەقامەکانا هەڵنە

و

ا

سن

(وەك ئازادی)

ئەی راستییەکانی بێ ئەنجام

کامە درۆی مۆقەددەستان

لە دوو تۆی ئەفسانەکانا شاردەوە؟

تەنیا ئەفسانەکان بەرحەقن

تەنیا راستی جیهان شێعرە

تەنیا شاعیرێکی درۆزن ئەزانێ

جیهان چەند جار

کەوتە دۆزەخەوە

مەیموون چەند جار

بوو بە «ئینسان»

چەند جار...؟

چەندجار؟

ئەی ئەفسانەکانی موقەددەس

«پرۆمتە « سێزۆیوفە»؟

یان

سێزۆیۆف پرۆمتە؟

ـ دا کوڕینە هەسان بێنن

د ەی دەی تیژکەن

شیر... شیر...

سبحا جیژنی سەربڕینی هەموومانە؟

ئاخ...

ئەی مێژووی سەربەرەوخوار

گەڵات لە ریشەکان ئەڕوێ

یان لە لقی درۆکانی ئەرز تا ئاسمان؟

لە نێوانی شەوەزەنگ و

رۆژی روونا

مانگ بوون،



یاری کردنێکە بە رۆحی شەو

بە گیانی رۆژ

مێژوو دزە

مێژوو مانگە

مێژوو حیزە...

ئاخ...

ئەی مێژووی مۆقەددەس

بە تەرازووی کامانە خوا

خەم ئەپێوی؟

شەڕبەش ئەکەی؟

ئاشتی ئەدزی و

لە نێوانی جەردەکانا. پاشاکان

هەڵئەبژێری؟

کامانە دز

پاشا نەبوون!؟

کامە پاشا،

تاجی نەنا بە سهرتەوە؟!

......

ئەی پاشاکانی موقەددەس!

ژنەکانی کامتان زۆرن

دەبن بە(1)
میداڵیای کامە شەڕی گەورە گەورە
نابەنە حەرەمسەراوەو...

سۆزانییەکان
پاکتر بوون لە ئاوی تەعمید و
نەمانزانی....
ئاخ ...
سۆزانییە موقەددەسەکان!
کێ دەڵێ «ژاندارک»یش
وەک ئێوە مۆقەددەس نەبوون و
حەقیقەتە ڕەنگاڵەکان
لە هەزار توێی مێژووی حیزا
پەڕەیان لێ نەدابێ و
شۆڕای شار
نەیانگابێ...؟
بمبوورە رۆحی پیرۆزی ژاندارک!
راستییەکانیان لێشێواندووین
لای ئێمە
هەزران گوڵ
جەستەیان دەبێتە مەشغەڵانی



ئەشق و گڕو
کەس ناویشیان نابا!!!
«پەپوولە: →
ئاگرهانێ باڵەکانم
پێی هەڵفرە...
لەو پەڕ جەنگەڵ
تاریکایی،
دەستی تا لای خودا چووە»
زەمان............
زەمەن ...
«ئینترنێتی» موقەددەس
بە کامە ڕەنگ و
لە سەر کامە CD
ئەمانووسی؟!
بە کام دۆگمە؟
دینەوە سەرەتای «قابیلی»
فیلمەکانی «هەڵەبجە»و «قەلاتان» و
«سی وسێ گوللە»
کەنگێ دووپات ئەکەنەوە
دەسەڵاتە ڕەنگاڵەکان
لەمێژە

بە دەم پێکەنینەوە
گونیان نەخوراندوە...
گریان ... گریان
ئاخ گریانی پیرۆز
چەند رقمە لێت؟
ئەوەندەی ولآتەکەم خوش ئەوێ و
تۆ !
ئەی رقی ئەبەدەی!
حەزم لێتە!
ئەونەی دەستگیرانەکانم
رقیانە لێم...
ئەوەندەی براکەم لە من و
من لەو
ئەوەندەی رژیم لە من و
من لەو
ئاخ...
ئەی رژیمە موقەددەسەکان
تەنیا ئێوە ناپەرەستم و
بەس!
تەنیا ئێوە نابێژم و
ناهۆنمەوە!

ئەزانم ئەزانن
بالآی شێعر
لەوە هەرە
بەرزترە
دەستتان بە قولاپەی
تاقە وشەی پیرۆزی بگات

ئەی وشەکانی پێرۆز
تەنیا ئێوەو
شێعر و
ئەفسانە
بەرحەقن
هەر شاعیرێکی خاوەن وشە ئەتوانێ
گۆرانی سازکاو
هەڵپەڕێ...
→ «شێعر هەر بالآی ئافرۆدیت»
ئەگەشێنێتەوەو
ئەمانە لێی بوونەتە «پرسفۆنە»
باش ئەزانن
هەڵپەرین و ستران وشیعر
هەتاییە...

خۆیان نەژیاون

تا بمرن ...

ئەگەر مردنیش دروبێ

میر و بەگان

چەند حەزیان کرد

«فەقی تەیران»لە دڵەوە شێعرێکیان

پیا بڵێ

شاعیر نەیکرد جگە لە تەوس

فەقی تەیران چەندە مـــــــــــــا

حاکمی موقەددەس

چ زوو مرد

ئەی درۆکانی موقەددەس!

« شمشێرە تیژەکانتان فڕدەن

شەونم

ئەیانڕزێنێ»

شێعر ئەیانبەزێنێ

« هەبوونە دەنگ خوش و شاعیر

بە رۆح و دڵ وا پڕفەقیر

میرو بەگا را سترانە

بێقیمەت و مەلوول مانە»



ئەوانە بڵقی سەر ئاون

کوا ئاشقن؟

شیعر و شۆڕش

(بۆ گەلی مە)

سەرەتایەکی بێ کۆتایین

هەر شوڕش و

شێعر و

ئەفسانە بەر حەقن

تەنیا شۆڕشگێڕی مەزن

ئەتوانی

شێعر بڵێ و

ئەفسانە بخولقێنێ...

وەتۆ شۆڕشی پێرۆز

بۆ ئێمە بوویتە

هەتا .... هەتایی

.............

هۆ.. هۆ.. گەلی برایینە

خەفەت مەخۆن!

زمان تەنیا نیشانەیە

یاسا تەنیا زمانی زلهێزەکانە

دەیانگۆڕین

میێژوو درۆی مۆقەددەسن
حەقیقەتەکان موقەددەسن
پاشا سەرکردەی مۆقەددەسن
دەیانگۆڕین!
شێعر و ئەفسانە و شورش ئەیانگۆڕێ
ن ا م ز...ا س ا ی
ا ش اپ ... و ژ یێ م...
ت ە ق ی ق ە ح.....
تەنیا... تەنیا، تەنیا
شۆرش و شێعر و ئەفسانە
بەرحەقن!
ئاخ...
ئەی شۆڕشی پیرۆز!
کەی شێعرێکی هەتا ئاخر
ئەچریکێنی؟

حەزم لێتە!
ئەونەی رقمە لە بۆمبا و
فرۆکە شەڕانییەکانیان
ئەونەی،
گوڵ و

جوانی و
پەپوولەم
خوش ئەوێ...
ئەونەی حەزمە لە ئازادی و
ئەونەی رقمە لە رەقەمی چوار و
کوڵە قورسەکەی سەر پشتم،
→«ئەم جیهانە چەندە قورسە و
شانی
باوە ئادەم
چەند زامار...»

ئەی یاساکانی موقەددەس!
کەی پەیکەری راستی
بە شەقامەکانی شارە جەرگ
سووتاوەکەمدا
هەڵئە
و
ا
سن
(وەک ئازادی)

وە تۆ!

شۆڕشی پیرۆز

کەی شیعرێکی هەتا ئاخر

ئەشریخێنی؟؟؟؟

کەی شیعرێکی هەتا ئاخر

کەی... کەی ؟؟؟؟

## ثانكو*

چاوێکت رۆژ

چاوێکت مانگ

پانکو!

تۆپێ نارێکت ساز کرد

رۆژ ئاوا و

رۆژهەڵات

تەنانەت

کێوەکانت بەش نەکرد

زەریاکانت بەش نەکرد

ئەقیانووسەکانت بەش نەکرد

پانکۆ!!

ئاخ پانکو!

بۆ دەبێ هیچ شتیکت بەش نەکردبێ و

مردبێتی!؟

بۆ دەبێ پانکۆ!؟

لای ئێمە دەگریایت

شارەکانمان

سێڵاو

دەیبرد...

لەویش ئارم بوویت و

ئاسمان شین بووە

ئاخ پانکۆ... ئاخ خ خ....

## مۆرس

ئەسپەکان وەشارن

(لە ئیستەپڵەکانی رۆحتانا)

جیپێکان بنێژن

(لە سەهۆڵستانی لەشتانا)

مەترسن

منیش بە قەدەر ئەستێرە

چاوم لێیە (ئەسووتم)

شەوانە مۆرس لێئەدەم

(نابینن)

کەس ئاسمانی بەش نەکرد

هیچ حەقیقەتێکی زەوی

گۆرانی راستەقینە نالێ...

وەیشارن!

(لە ئیستەپڵەکانی لە شتانا)

بینێژن!

لە سەهۆڵستانی رۆحتانا)
مەترسن!!
رۆژنامە،گشت درۆن...
تۆش درۆئەکەی...
منش،
بە قەد مانگ دەبینم،
شەوانە گۆرانی خەماوی دەبیژم
(نابینن)
مەترسن!!
شارەکانمان بجوون...
(تا تەویلەکانی سکتان)
هیچ حەقێ
ئێستا کە ناوێرێ
گورانی مۆرسەکان وەگێرێ
بۆ چۆم و دارستان...
منیش بە قەدەر هەتاو
چاوم لێیەو
( هیچیش)
باوشم پڕ بوە لە شەپۆل،
(ماهوارەیین،
حەزەکان بۆ زەوی ناهێنن....)

بەقەدەر مانگ
هەتاو
ئەستێرە
چاوم لێیەو ــ هیچیش ــ
رۆژ بە رۆژ تەنیا تر
شەو بە شەو دوور... تر

سەقز ٧٧/١/١٨

## س ا ز

سەرماو

سەهۆڵی سەهەندە

لە سەرما

ـزستان ـ

شین و

شەپۆڕی شەوانە لەلەشما

ـ هاوین ـ

خەمی خراپ ی خەزانە

خزاوەتە

رۆخم

نە باڵی بادی بەیانی...

نە بۆن و بەرامی بەهاری...

هەر زرتەزرتی خەزانی...

هەر سرتە سرتی زستانی

سازە

س | زە

س | زە

س | زە

س|ز

س|ز

ســـاز

# نامەيەك(١)

بۆ دۆستێکی لەمێژینە

نە بیرمان لەهەتاو ئەکردەوە
نەمانگ
نە شەوەزەنگ...
دۆستایەتی پرشنگیێبوو
هەرسێکیانی دائەپۆشی...
یاری پەڕەسیلکەیەك بوو
بەرەوگ شاریێ ئەیبردین
رووناك وەك
شادی ئاشتی...
تاریك،
وەکوو خەمی کورتی ئەنگوستی
«خاك»*

تەنانەت لە «بەین خاكیشدا»
«بە زمانی خاکی... »مان هەر بوو...
من رۆسەم بووم
تۆ پاڵەوانێکی «توران»
لە شەڕی نێوان ئێمەدا
هەرگیز ... هەرگیز...
تاقە گوڵێکیش نەدەمرد
مێروولەیەکمان نەدەکرد
بە ژێر پاوە...
بووکە شووشەیەك
نەدەشکا...
کە دەشبووینە تفەنگ بە دەست
تفەنگەکانمان چیلکە بوون،
بە پەتی درێژی خۆشەویستی
ئەکرانە شان...
تۆ «نەمان» و
من نەمردن
هەر ساتیێ بوو
من کوژران و پێکەنینی سەرکەوتنی تۆ
درۆ بوو...
ئای .. هاوڕیێ گیان...

با قەت باسی ئێستا نەکەین!
شەوە زەنگ وهەتاو و مانگ
با لەیەکترمان هەڵنەبڕن!
با لەیەکترمان
هەڵنەبرن.
.............
کوا ئەمانە
بە قەدەر بۆنی یەکەم ئەشق
سینگمان عەتر پرژێن ئەکەن؟
کوا ئەمانە
بەقەد یەکەم سێو فرێتـدا
بۆ
کۆش« سورێ»
سەر لەنوێ ئەمانکاتەوە
بە یەک جەستە!؟
کە ئاشق بووین
منی هار و
تۆی بەستەزمان
هەزار رێگەی دڵ داریمان
کرد بە نامە
هەزار شەڕ و

هەزار داخ و
هەزار ماچمان
نارد بۆ «لەیلێ»
هەزار بولبولی « گۆرانی شەو»انەمان
دەکرد بە پەیک ...
ئەرێ هاورێ !
شەوەزەنگ و هەتاو و مانگ
با لەیەکترمان هەڵنەبڕن
بالەیەکتر...مان
هەڵنە بڕن
با....
کوا ئەمانە
بەقەد یەکەم مەلە لە چۆمی غوربەتا
بەقەد یەکەم چوونە دونیای گوڵ و
مناڵی و
...نەزانی...
سەرلەنوێ ئەمانکاتەوە
بە یەک جەستە؟
کوا ئەمانە
بە قەد یەکەم نامەزرۆییمان.
بە سێوی کتێب و

قۆخی شێعر و
تووکڵە بەرۆژەی رۆمان و..
ئەمانبەنەوە
دونیا بچووکەکەی خۆمان؟

زۆر جار ئەڵێم:
«ئەم جیهانە
وەك مەزرەقی کاتی منداڵیمان وایە
بەردەوام هەر لە«مین» دایە...
تف لەو سوورِ و
مین گرتن و
بە «مە» کایە...
لە بیرم دێ،
یەکەم ئێوارەی نەگبەتی
ئەو رۆژە بوو
سواری پاپۆڕی سیاسەت بووین
چوار کوچکمان گرتە چوار تابلۆی
حیز...
...........
شەوەزەنگ و
هەتاو و

مانگ
لەو رۆژەوە
بوونە درکی «مەم و زین» و...
من ماری قامچی گەزتمی و
چاڵی
زیندان
توش
خۆرەی مان...
ئەرێ... هاورِێ !
ئێستا بەقەد پانتای زەوی
.....................
لەیەك دوورین
تۆ ماری غۆربەت گەستتیەو
من
خۆرەی مان.........
من..............تۆ
ئێستا هەتاو پەرۆیێکە
سەرمانی پێدائەپێچن
ئێستا کە مانگ
مێزەرێکە

لە ناو عەكسا
ئەینێن بە سەر قەدیسەكانەوە

چ پاپۆڕێكی نەگبەت بوو
شەوەزەنگی كردە هەتا......
............ هەتایی و
لە نێوەراست ئەقیانووسا
ئێمەی فڕدا.......

ئێستا چیرۆكی «مەلە» ئەنووسم
بالآی شێعریشم
قەت هەڵنەكشا

(.... بەقەدەر شێعر جوان بوو...
وتی : بمكوژە!
ریشەی شێعرم تیا دەڕوێ
بالآی بەقەد حەوت ئاسمان
هەڵدەكشێ
شاعیرێكی دڵرەق كوشتی و
لە دوو تۆی دەفتەرەكانیا
ناشتی
ئێستا شێعری ئەشق دەڵێ

تا ئاسمان بەرز...!!
منیش ،
بالآی ئەو شەهیدە دێتە خەوم و
شێعرەكانم
لە بار ئەچن...)
تۆپی سەرم
بەقەدەر زەوی ماسیوە و
«هەتاوپێچ»، پێم پێئەكەنن
ژمارە حیسابی هیچ بانگێكیشم نییە
بۆ دۆستێكی لەمێژینەمی بنێرم
هێندێ هیوام
بۆبخاتە حیسابەوە...

ئێستتا بەقەد پانتای (رەنگە
كاكێشانیش
لە یەك دوورین...
شەوەكانیش،
لە شەو زسانی ئەوێ درێژتـــــر...
منم و
تەنیایی ئەزەلی
تۆیت و ژنێكی ئیسلەندی

لە شەوانی تەنیاییمدا دێنە خەوم

شێوەت ئەکەم و

نایکەم و...

ئاخر گیانە!

من تۆم بەردەوام

بە پانتۆڵێکی ڕەشەوە ئەبینی و

بە دڵێکی بەقەدەر ئەقیانووس

بچووک ...

تەنیا سینگی تۆ

لە سینگی دایکت ناچێ !

ئێستا هەموومان

بەوسینگەوە،

لە زەماوەنی دایکمانا

سەرچۆپی ئەکێشین..

ڕۆژنامەکانیش بەردەوام..

باسیئەکەن ...

جگە لەتۆ،

کەس هیچ ناڵێ !

دە تۆش وێڵیکە « خۆشت تێ»!

لێرەش هەروا تەم و مژە

ئێمە نەبێ

کەس خەو بە بەهەشتی ون بووەوە

نابینێ!

ئاخ هاوڕێ گیان!

مانگ و شەوەزەنگ هەتاو

یاسای ئەبەدی جیهانن!

دەبا لە یەکمان هەڵنەبڕن!

دەبا لە یەکمان...

دەبا...

د....

---

• – «خاك» یان «تەب»یا.. شەڕە یارییەکی منداڵانەیە

منداڵانی ناوچەی سەقز لە کاتی تووڕەبوون لەیەکدی ئەنگوست ئەدەن لە خاکەوە نیشانی ئەدەن و بڕیار ئەدەن کە ئیدی پێکەوە قسان نەکەن و.. بەڵام بۆ ماوەیەکی زۆر تاقەتناهێنن و «بەزمانی خاکی» جار جار لەگەڵ یەکدی ئەدون..

## ئەشـــق

يەك:

چاوتانم خۆش ویستووەو

رەنگەکانیان،

دەریایی

جەنگەڵی

چیایی

رەشی قەترانی هەڵۆیی

دوو:

بەری داری بالاّتان

وەکوو ماسی و

ئاسک و

کەروێشک ...

سێ:

رووباری پرچەکانتان

بۆ بن

چیا و

دارو

دەریا

دەریا و جەنگەڵ و چیا و هەڵو

تۆ و ئەو و ئەو و ئەو...

ئەشق، بەشکردن ناناسی!

## شازادة و كيذي مة

شازادە هات
ئەسپەکەی حیلاندی...
دابەزی
ئاوی ویست
پێمان دا...
نانی ویست
پێمان دا...
خاکی ویست
بەشماندا...
مانگی ویست
چوار برام شەوێکا بۆیان گرت..
کە دەستی ئاشیرەی لە من کرد
چوار برام شەوێکا بەشیان کرد
لە چوار لاناشتیان.

۲۰/۱/۷۷ سەقز

## بةرةوخواكان

با ی بووژانەوەی دارستانێکی
سەرەتا خوا زوحاکەکان
(لەچیرۆکا)
ئینجا ئیمپراتۆرەخواکان
(لەمێژوودا)
دواجار کارتێلەخواکان
(لە پایەتەختی پارەدا)
ئێستا کۆمارەخواکان
(لەچەندلاوە!!)
سەرەتا
باڵندەکانیان راوکرد..
ئینجا
پڵینگەکانیان کوشت..

دواجار

شیعرەکانیان خەساند..

ئێستاش بەردەوام ئەیسووتێنن...

خەڵووزەکانی بەشئەکەن...

تۆفانێکی

بەرەو خواکان ئەشریخێنی!

سێڵاوە شیعرێکی لاوی

روووە خواکان...

## باران...

ئەو بارانەی قەت داینەکرد...

(نە دڵی پڕ لە گڕی منی شۆردەوە

نە سەهۆڵی ئەوینی تۆی کرد بە ئاو...)

ئەو هەتاوە قەت دەرنەکەوت ...

(نەتیری تیشکی گرتە خەم

نە رەشی سەر شارەکەمیدا بەر دەسرێژ...)

ئەو ئاسمانە شین گێرەش،

نەبارانی بۆ بانگ کردین...

نە نامەی ئێمەیدا خۆر...

ئێستا

ئێمە و

ئەشق و

دووری..

رەقیبیش،

باران و زەوی و

ئاسمان و خۆر...

٧٥/٧/١٥

## رووت

خۆم ئەخەمە چەمەتیشکی ئێوارانەی
پاڵ ئەم هەورە گرژ و ڕەشە
کەس نازانێ،
بۆ بەم ئێوارە دەم ساردە رووت و
قووتم
کچانی چاوبرسی شاریش،
پێئەکەنن...

هەورە مۆنە ڕەشتاڵەکە،
ئاخر دڵۆپی زێوینی چە م هەڵلووشێ،
(کامیان دێن و
دەستیان دەگرن بەوێمەوە؟
کێ ئەزانی ؟
هەورەکەش نەبێ بە دەریا و
سەر لە نوێ نوقمی نابمەوە!؟

خۆم ئەخەمە چەمە تیشکی نوقمی هەوری
ئێوارانەی پاڵ ئەم ماڵە سارد و سڕە...
کچانی شەرمنی شاریش
لێم ئەڕوانن...
کەس دەستی بەهیچ کوێم ناگا و
منیش
دەستم
ناگا
بە کەس.

........................................

٦٩/١/٢٥ سەقز

## باوان مەکە!

ئەم تالآنە لە خۆڕا ڕەنگم ناگۆڕن
دڵ زەنگی پیربوون ناژەنێ...
باوان مەکە!

ئەشق هەر ئەشقە
منیش هەروا نەبوومەتە  شێعرێژی ئەم
ئاگرە
مەمسووتێنە!

خۆم لە خۆما
پەرۆی بۆسۆی شارەکەمم
کامە شاعیر
خۆی وەکوو من ڕسواناکا؟

ئەشق هەر ئەشقە و
ئەم تاڵە نەگبەتیانەش
هەر زیادئەکەن
دڵ زەنگی پیربوون ئەژەنێ!
باوان مەکە!
من لە خۆڕا،
نەبوومەتە مەشغەڵانی ئەم ئاگرە
شێتم مەکە!

من نازانم!!
کامە شاعیر،
هەمو ڕۆژی
لە هەمانەی خۆشەویستی
دزی ناکا!؟
کەچی منیش،
دزی گەورەی شارەکەمم
ڕۆژی نییە دەستگیر نەبم
باوان مەکە!

ئەم ساڵە نە ئامەتانەی نێوان ئێمە
بە شێعر پر نابنەوە ...

تۆ لە پەسا هەڵدەتۆقی و
منیش
سەرم جارەلۆکە!
کەچی باوان!
کامە شاعیر هەموو رۆژێ
هەمانە تاوان نادزێ و
بێزووی ماچی حەرام ناکا؟
کامە شاعیر،
هەموو رۆژێ
وەکوو من
خۆی رسوا ناکا!؟

۷۵/۲/۲۵ سەقز

شاء

سەنگباران،
خۆڵەمەرگی زەمان نییەو..
هەللا جی شاعیریش
لە ئاو و
ئاگر و
خۆڵ
ناخنکێ...

شێعر هەر
باڵی «ئافرۆدیت» ئەگەشێنێتەوە
ئەمانە لێ بوونەتە «پرسفۆنە»...
« حەللاج» ی شاعیریش
نەیدەزانی
شەش مانگەکانی تەمەنی
لە نێوان سەنگباران و

داره مەرگ و

ئەشقەکەیدا

چۆن دابەش کا....

............

کێ ناڵێ

شاعیرانی خولیای ئێستاش

رۆحی ئاویی حەللاج نەبن

لە هەزاران جەستەی تردا

لە نەمرەگیانی قەڵەما...

## بارانێکي ئەفسانەيي

یا هەورێکی هێندە بچووك...

کە چاوەڕوانیت لێی نەبی

یا هێند تووڕە

کە

دا

ئەکا

قەڵای ئەشقمان ئەرووخێنێ

باران ...

باران...

بارانێکی ئەفسانەیی

ئەم قاقڕ و وشکەساڵە

ئەتاسێنێ.

باران ...

باران...

بارانێکی ئەفسانەیی

ڕۆحی ئەشق و سەوزبوونەوە

ئەناسێنێ!

باران ... باران...

بارانێ بە ڕەنگی ئاویی...

..................

........................

..................................

......................................

---

## ئةشق و رةنط

«ئاوا بڕاون» ئاشق بوو

تۆش دەڵێی ئاشقم

منیش ...

« هیتلەر » چەندە ڕووڕەش بوو

دڵداری تۆش چەند ئاسمانی !!!

ئەم دار و بەردەش

چەند مەزڵووم

ڕەش ...

ئاوی...

سەوز...

ئەشق کوا لە ڕەنگ ئەپرسێ؟

ئەشق ...

ئەشقێک هەڵبژێرە کە ئاشق بێ!

٧٥/١٠/١

## شێت

هەزار ئەستێرەم نووساند بە دڵمەوە
سێسەد جار مانگم ماچ کرد
حەفتا گۆرانیم بە باڵای سروەدا
خوێند
پێنج جار لە چۆمی بەیاندا مەلەم کرد
هەموویانم خۆش ئەوێ
وەک چۆن لەمناڵی‌یەوە
تۆم خۆشویستووە...

ئەوانیش ،
شەوی هەزار ئەستێرە ئەکوژێننەوە...
سێسەد مانگ بە شەقاما
هەڵئەواسن...
حەفتا دیوار بەرامبەر سروە سازئەکەن...
پێنج چۆم ئەخنکێنن....
..................
کێ لە پێشە!؟
کچە شاعیرێ،
ماچم دەکا و دەڵی :
تۆ !
کەچی هەزار و سێسەد و ئەونە ساڵە
ئەوان سوارن و ...
ئێمە هێشتا
پیادەش نین
شاعیرانی هەموو عالەم
شێتن...
شێت....

٧٤/١٢/١

## ضاوةڕوا

ڕۆژی چوار جام
لە خۆم ئەخۆمەوە و
بە چوار جامیش
چاوە سەوزە جەنگەڵی‌یەکەت
ئەشۆمەوە …
دارستان و چاوی تۆ
چوار ئاسمان و تەنیایی من…
چوار جام
خاڵی….
خاڵـــی….
خاڵـــی….
خاڵــــــی….

منیش: توونــی…
توونــی….
توونـــی….
توونـــــی….

شەوی چوار جام
لە خوێنی من دەنۆشیت و
چوار جەنگەڵیشم
هەڵمەقووت …
چوار ئاسمان و
چاوی تۆ…
دارستان و
تەنیایی من …

چوار جامی پڕ
ئەشـق و
ئەشـــق و
ئەشــــق و
ئەشـــــق….
ئاسمان
جەنگەڵ دائەپۆشی
چاوەڕوانیت
تەنیایی من….

۷۵/۱۲/۲۵

## شيعر

«ئەهوورامەزدا»

شێعر بوو...

دەبوا بیانپەرستایە!

ئێستا

تۆم لێبووی بە شێعر...

ناچار دەبێ بتپەرستم!

٧٦/١٢/١٥

## دةنط ديَ

شار و

دەفتەریک

شەو و

دووکەڵی هەناسەی وشەکان....

شاعیر و

مەرگ و مان....

دەنگ دێ .... دەنگ

شێعر

ئە

با

ڕێ

.........

............

٧٧/٣/٧

## خەیانەت

بۆچی رەش؟
ئەشا گوڵ!
ئەی ئەم وڵاتە رەنگاڵە!؟
لە دڵی کێ ئەچێ
ئەو دڵە بچووکەی
لە سەر ئەنگوستیلەکەتە؟
ئەی کچی
چاو رەشی،
کراس رەشی
دڵی سەر ئەنگوستیلە رەش!؟
تۆش بەو خەیانەتە بۆ زرگەت
زانیوە!؟

٧٤/٢/١۶ ـ هەولێر

## ئەشق

بەدەم ئاڵی بەیانەوە،
وێنەکەی تۆ...
بە دەست پڕشنگی ئەم خۆرەتاوی
نێوەڕۆشەوە،
هەواڵی تۆ...
بە سەر تەمی ئێوارەوە،
جەستەت بۆتە شابوتێک و
م ... ن بوت پەرەست ...
دڵ لە ئەشقت نابێتەوە!
شەویش،
خو لێم بۆتە چەرم و
ناتوێتەوە...
ناتوێتەوە....

٧١/٧/٢٩

## ستەم و ئەرز و ئا ان

که ئەزرمان لەرانەوە
باوەڕیان پێکردین
ئاسمانیش هەر ش ین‌بوو...

که شەومان بە رۆژا کردە کۆڵ
ئاسمانمان لە رەنگی قوڕی سەر
پێڵاومان...
گرانی و
ستەم
و
هەژاری ....
کێ ئەوێرێ سەر لە نوێ
باوەش کا بە ئەرزا!؟

٧٣/١٠/١٨ ـ سەقز

## شاع ي ٍ ديوان

– من شەوان بە شەوقی شەپۆل و
بەیانی بە عەشقی
دڵێکی پێوانەی ئەقیانووس
هەڵئەسام...
ـ نە شەپۆڵ ئەباری
نە دەریا هەڵکشا !
ها...ها..ها...
شاعیری بێ دیوان!

– من گەوجتر لەگوڵ و
دەسەڵات عاقڵتر لە درک
ـ شازادە نەهات و
بونیادی شێعرەکەت هەڵوەشا
ها...ها... ها...
شاعیری بێ‌دیوان!

– ئەترسم شەویٚ بیٚ و
هەتاویٚ دەرکەویٚ و
سەرلەنویٚ خەونیٚ تر
بمخاتە گەردەلوول
هیوایەك
.
.
.
ئەترسم ئەستێران
شەوێکا یەکگرن
هەڵپەڕن
.
.
.
– ها..ها..ها..
ترسێکی پەمەیی
شاعیری بیٚ
دیوان
.
.
.

باشترین ئەوەیە،
بازنەکە نەپێوی و
لەڕێوە، یا شەیتان!
ها...ها...ها...
شاعیری بیٚ دیوان!

– لە توێی سەری خۆم ئەترسم
هەمدیسان، بەهاریٚ لیٚبدا و
سەوز بیٚ و بەربدا
لق و پۆ دەربکا
وەك جاران،
چریکە بۆ
ڕێبوار..

– ئەترسم ...
لەو ترسە ئەترسم
سەر لەنویٚ بمبڕن
بمکەن بەقەڵەمیٚ
بنووسیٚ:
«پەشیمان»
بنووسیٚ
.

.

.

ها...

ها...

ها...

شاعیری بێدیوان

..........

ماوەیەك بێ دەنگی....

........

– ئەترسم لە خوم و ئاسمان و

ئەستێرەو ....

لە شێعر و گورانیش

ـ های گەڕیان .. گەڕیان

گەڕیان چەن خوشە...

/دووجار بە دەنگی ناخۆش/

– ئەترسم هاوینی شەماڵ بێ و

دەریاچەی زرێبار بیبەسێ...

ئەترسم، تەرزە بێ و

چی گوڵە پەپوولە هاوینەن

بمێن...

من شەوان بە شەوقی شەپۆڵ و

بەیانی بە ئەشقی دڵێکی پێوەری

زریاکان هەڵئەسام

ـ های گەڕیان گەڕیان ...

شاعیری بێدیوان

گەڕیان چەن

خۆشە...

– ئەترسم ، کە «ئەوجی» دڵرەقی

وەرزەکان

نەیەت و ... گەلا و گوڵ بمێنن

تا ..... هەتا

ئەترسم، چیاکان

نە

ڕ

و

و

خن

سەر لە نوێ پێشمەرگە تێیبدا...

شاعیرێ/ هەڵبەتە نەوەك من/

بنووسێ،

ئـــازادی

«کوردستـــان»

بنوسێ،

«بەختیار»

/...بێدەنگی..../

– من دڵم بە ئەشقێ ئەزەلی كوك ئەبوو

ـ سەرت بۆ یۆتۆپیا»!!! لی ئەدا

ها..ها..ها...

شاعیری بێدیوان!

« های گەڕیان

گەڕیان

.

.

.

– زستانە و ئەترسم

گەرمایەك وەك ئەمساڵ

سەهۆڵی جەمسەری زەویش بكا بە ئاو

ئەترسم

ئەم شەوە

درێژە

«قوتبی»یە

نەمێنێ..

ئەترسم هەتاوێ..

ئەستێران... گۆرانی

پەپوولە..

بمێن..

ئەتر..

– ها..ها..ها..

دەسەڵات:

دەبمرە!

شاعیری بێدیوان!

*

## شیعر

(۱)

ئەو سەندەلە بکە سەرت
دنیا ئەونەی ناوێ
هەور کوا بە سەر
ئینسانەوە
ئەمێنێ
تەنانەت
باوی سەر نەماوە.

(۲)

ئەو کڵاوە بەسە پشتت
«کەمەربەن»یش بە «کەڕاوات»
هەر ئەونە
ناموٚتر بنوێنی
هەتا کەی
خەمی نان؟

(۳)

جامی ئاگر بخۆ و بگرڕە!
نە بۆ چەپڵە
بۆ ئەوەی رەنگەکان بشێعرێنی،
ر ر
ر ش ع ر
ر ر

(٤)

بە قەد ماچێ شێعری ئەویست
دیوانەکانی « شەڕی جیهانم»
بۆ کێشا،
لە ناو کاغەزا
پڕ و
و
کا
ین
.
.

(٥)

هاتبوو بۆ،
قەڵەمێکی نەبەزیو و
جامێ شێعر و
دوو گونك مەمکی هەستێرە.
ئەونەی تۆزی
خەونم پێدا...

(٦)

بە قاچاخی،
دوو سنووری ئەوین ڕەت کە
ئاسمان و
مانگ و
هەسێرە
دێتە مستت!

(٧)

لە نێوانی«مودێرنییە» و پۆست مۆدێرنا
لە کوێی زەویدا ئەوەستی؟
– ئەبم بە شێعرێکی باڵدار
بۆکاکیشان..

## کوا ولاّ ؟

شەو بوو
بەسوار درێژێ ئاسنینەوە
لەپەسا دەگەیشتینە
دەریای زیوین و ئاڵتوونی..
هیچیان ڕێگەی ولاّتمیان نەدەزانی
ئای غەریبی
یاخوا ببی بە کۆی زووخاڵ!

١٠/١٠/٧٣ – ڕێگەی تاران

شیعر

لەسەر

نیلووپەرێکی هەشتپەڕ

د
ه
و
س
تم:

بانگ ئەدەم:



ذَير نووسةكان:

ا ـ «شمشیرهای آخته را غلاف کنید، شبنم آنها را می‌پوشاند»
شکسپیر /اتلو

٢- فةقيَ تةيران

٣- ضاوي لة شيعريَكي ئة ةد شاملووة

٤- لة خوا ئةفسانةيي‌يةكا ئولومث

٥- Panku ثياويَ ئا ا لة ئةفسانة ضي يةكانا كة زةوي سازكرد، كا َ طريا فرميَسكةكا بوون بة ضؤمي «زةرد» و «يانط تسة» كا َ هةناسةي كيَشابا هةوا خؤش دةبوو، كا دلَتةنطي هةور دةهات و ئا ا دةطرت...كا َ مرد ثارضة ثارضةي طيا ليَك بوونةوة و ثيَنج كيَوي موقةددةسي ضي َ دروؤست بوون ... ضاوةكا بوون بة مانط و خؤر...

«انسان و بو ايش ـ يانط»

٦ـ لةناوضةي سةقزدا، منالآن كا َ لةيةك زيز ئةبن و ئةيانةويَ ئيتر لةطةلَيةك قسة نةكةن، ئةنطوست تةردةكةن وئةيدةن لةخؤلَةوة، ئة1 «خاك»!

بةلآم بة زما خاكي ثيَت ئيَذم»يش لةبةين «خاك»دا بووة.

٧ـ APHRODIT : ئيلاهةي ئةوين

٨ـ PRSPHONE: ئيلاهةي مةرط.

هةردووكيان «ئادونيس»يان خؤش ئةويست. يةكي شةش مانط بة نوَرة ئةيا ران و ئةيانذيانةوة...بؤخؤيان

٩ـ شيَعري فلكلؤر بؤهةواي طةريان كة زورتر لة شار ي سنة و دةوروبةر ثيَي هةلَئةثةرن ـ طةريان بة هةلَثةرينةكةشي ئةوتريَ ـ

١٠ ـ ئاوابراون ـ اشووقةي هيتلةر كة تا ئاخرين ضركةكا ذيا هيتلةر لةطةلَي بوو ثيَكةوة خوَيان كوشت!